بێنێت لە پەتی بەتینی ئیسلام.

بەجۆرێك دەبینین ئەوانە (ئەو ڕەمزانە) دەپەرسترێن، بۆ هەموو حیزبێك (ڕەمزێك) هەیە یان کۆمەڵێك لە (ڕەمز) هەیە، هەروەك بۆ هەموو هۆزێك لە هۆزەکانی نەزانی بتێك هەبوو یان کۆمەڵێك لە بت هەبوو، وە هەر حیزبە وهەوڵی خۆیدەدا بۆ بەگەورەدانانی (ڕەمزەکەی) لەبەر چاوی خەڵکی، وە ئەو وای دەبینێت کە زیادبوونی شوینکەوتوەکانی پەیوەستە بە زیاد بەگەورە دانانی خەڵکی بۆ (ڕەمزی) حیزبەکەی وڕێکخراوەکەی، بۆیە هەڵدەستن بەزیادەڕەوی لە ناو ونازناو وسیفات بۆ ئەم (ڕەمزانە) وە هەر برپارێك بدەن وتەی ئەوانە بەبەڵگە دەهێننەوە، ئەوەیان بەسە کە شێخەکەیان یان سەرۆکەکەیان ئەوەی کردبێت یان دانی پیانابێت یان فەرمانی پێکردبێت، بەوە دەبێتە موباح یان واجب، بێ ئەوەی بڵێن ئەوە پێویستی بەبەڵگەی شەرعیە بەڵکو حاڵەتەکە گەیشتە ئەوەی کە خەڵك ناکۆکی بکەن لەسەر ئەم (ڕەمزانە) وە هەریەکەیان لای وایە کە ئەوە میراتگری ئەو ڕەمزانەیە، وە شوێنکەوتوویەتی، و لەسەر ڕێبازەکەیەتی، وە ئەمینە لەسەر پەیامەکەی، تا حاڵی هەندێکیان گەیشت بە (بابیّة)ی سەردەم، هاوشێوەی ئەوەیە کە لەدەست ڕافیزە وباتینیەکانە -اللە ڕیسوایان بکات- کە ڕێز لە شێخەکان وزاناکانیان دەگرن بەبیانوی ئەوانە باب ودەرگایەکن بۆ پێشەواکانیان لە ئالی بەیت کە لایان وایە ئەوان زیندوون دوای ئەوەی مردن پەیوەندی دەبەستن لەگەڵ خەڵکی لەڕێگای ئەو دەرگایانە (باب)، ئەوەش بەمە دەبێت کە هەندێك لە ئەندامی ئەو حزبانە دەبێت بەجێگرەوەی ئەم (ڕەمزانە) وپارێزەری حیزب یان ڕێکخراو یا گروپ جێگرەوەیان لە لادانی مەنهەجی.

پەیوەستبوونی حیزب یان ڕێکخراو یان گروپ بە کەسایەتیەك (ڕەمز) وپێداگری لەسەر بەهێزبوون لەهۆی ئەوەوە ئەوە نیشانەیەك وجیاکەرەوەیەکی گرنگە بۆ ئەهلی گومڕایی، چونکە موسڵمان دەزانێت کە قورئان وسوننەت پایەکی توندە کە پێویستە بگەڕێینەوە بۆی بۆ ڕاستی بانگەوازەکەیان، خۆی ماندووکرد بۆ دۆزینەوەی بەڵگەیەکی شەرعی ودەستی نەکەوت پەنا دەباتە بەر بەڵگەی بیدعی لەسەر (ڕاستی) ڕێبازەکەی، هەروەك حیزبە گومڕاکانی ئەمڕۆ دەیکەن بۆ جێگیرکردنی (ڕاستی) ڕێبازەکانیان بە (ڕەمز)ە بەناوبانگەکەیان، ئەوانەی ئەگەر بگەڕێین لە ڕاستیان دەبینین کەسانی بیدعەچی گومڕایان لەناو دایە، بەڵکو هەیانی توشی ڕیدەیەی ئاشکرا بووە، یان ژمارەی قوربانیدانی حیزب ولایەنەکەی و ژمارەی کوژراوانی وبەندەکانی دەکاتە پێوەر بۆ (ڕاستی) ڕێبازەکەی، یان زۆری ژمارەی شوێنکەوتووانی یان قەبارەی بڵاوبوونەوەی بیرەکانی، وە هەموو ئەم فەرمانانە هیچ سودێك بەحەق ناگەیەنێت.

موسڵمان (ڕەمز) هەڵدەسەنگێنێت بە پێوەری ئاین، نەوەك ئاینەکەی هەڵسەنگێنێت بە پێوەری (ڕەمز)، وە موسڵمان ڕێزی (ڕەمز) دەگرێت بەپێوەری شوێنکەوتووانی لەسەر حەق، نەوەك بگەڕێت لە حەق لە وتەکانی (ڕەمز) یان کردارەکانی، بەڵکو موسڵمان هەوڵی ئەوە دەدات کە بەندەی اللە ﷻ بێت نەوەك بەندەی حیزب وڕێکخراو و(ڕەمزەکان)، وە شوێنکەوتەی پێغەمبەر ﷺ بێت نەوەك شوێنکەوتەی ڕێباز وگروپ وبزووتنەوە.
بەڕاستی (ڕەمز) زۆربوونە ئەمڕۆ، ژمارەی زۆرترە لە بتی موشریکەکان لەسەردەمی نەفامی ونەزانی، وە هەر کۆمەڵێك لەخەڵکی بانگەواز دەکات بۆ (ڕەمزەکەی) هەروەك چۆن نەزانەکان ونەفامەکان بانگەوازی خەڵکیان دەکرد بۆ بەندایەتی بتەکانیان، هەموو حیزبەکان وڕێکخراوەکان ئێستا بوون بە (ڕەمز)، وە سەرکردە وپێشەوای هەریەکێك لەوانە (رەمزێکە)، وە پەرتوك وڕێبازەکەی (ڕەمزە)، موسڵمان ڕوی خۆی بکاتە کامە لا، وە پەیوەست بێت بەکامەیەوە وە شوێنکەوتەی کامە لابێت؟ هەموو یەك وەڵامیان دەبێت: ئەوەی کە یەك بگرێتەوە لەگەڵ قورئان وسوننەت.

کەواتە با شوێنی قورئان وسوننەت بکەوین، وە وازبێنین لە (ڕەمزەکان).

# دیمانەیەك لەگەڵ
# نوسینگەی ناوەندی بۆ بەدواداچوونی سکاڵاکان

### بۆچی نوسینگەی ناوەندی بۆ بەدواداچوونی سکاڵاکان دامەزرا؟

الحمد لله والصلاة على رسوله الكريم ومن سار على هديه إلى يوم الدين، پاشان، الله -عز وجل- فەرمانی کردوە بە دادگەری و داینـاوە بەیەکێك لەناوەکانی کە دەفەرموێت: {إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ} [النحل: ٩٠]، وە دەفەرموێت: {وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ} [الأنعام: ١١٥]، وە وشـەی ستەمی لە خۆی دورخستۆتەوە: {إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ النَّاسَ شَيْئًا وَلَكِنَّ النَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ} [يونس: ٤٤]. واتە (الله ستەم لەخەڵك ناکات بەڵکو خۆیان ستەم لەخۆیان دەکەن).

وە ڕێگری لە هەموو جۆرەکانی ستەم کردوە، لەوانە شیرك کە گەورەترین ستەمە هەروەکو الله باسی دەکات و دەفەرمووێت: {وَإِذْ قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ} [لقمان: ١٣]، واتا: (کاتێك لوقمان ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکرد پێی گوت ئەی کوڕەکەم هاوەڵ بۆ الله دامەنێ بەڕاستی شیرك ستەمێکی گەورەیە). لەوانە ئەگەر مرۆڤ ستەم لە خۆی بکات بە سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی الله -عز وجل- و بەزاندنی سنورەکانی، هەروەکو الله تعالى دەفەرمووێت: {وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ} [الطلاق: ١]،واتا: (ئەوەی سنورەکانی الله ببەزێنێت ئەوە ستەمی لەخۆی کردوە)، وە لەوانە مرۆڤ ستەم لە کەسێك بکات و مافی بخوات، هەروەکو الله لەسەر زمانی داود باسی کردوە، سەلامی الله ی لێبێت: (قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَى نِعَاجِهِ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ الْخُلَطَاءِ لَيَبْغِي بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ) [ص: ٢٤].

وە جێبەجێکردنی ئاین بەتەواوی ناکرێت تا هەموو جۆرەکانی ستەم لەناو نەبرێت، ئەوەش ئەوەیە کەوا دەوڵەتی ئیسلامی پێی هەڵدەستێت بە فەزڵی الله، بە جەنگکردنی شیرك و ملکەچ کردنی خەڵکی بۆ حوکمی پەرستراوی جیهانیان ستەمی گەورە لەناودەچێت، وە بەفەرمان کردن بە چاکە وڕێگری کردن لە خراپە ستەمی مرۆڤ لەخۆی بە کردنی گوناە وتاوان نامێنێت، وە بەجێبەجێکردنی شەرع لەنێو خەڵك، وجێبەجێکردنی حەددەکان، و دورخستنەوەی خەڵکی لە دەستدرێژی کردنیان بۆ سەر کەسانی تر و ڕێگری کردنیان لە ستەم کردن لە یەکتری، لەو چوارچێوەیە دەوڵەتی ئیسلامی لایەنی جیاوازی دامەزراند کە بەرپرسە لە ڕێگری کردنی ستەم لە یەکتر، و هەڵگرتنی ستەم لەکاتی ڕودانی جا هەرکەسێك بێت یان هەر لایەنێك بێت، لەو لایەنانە نوسینگەی ناوەندی بۆ بەدواداچوونی سکاڵاکانە.

### لایەنەکانی ترکێن لە دەوڵەتی ئیسلامی کە ڕێگری لە ستەمکردن، و نەهێشتنی ستەم دەکەن لە نێوان خەڵك؟

لە بنەڕەتدا سەرخستنی ستەملێکراو، و گرتنی دەستی ستەمکار -هەر چەندە موسڵمان بن- واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێك، هەروەك ﷺ دەفەرموێت: (براکەت سەرخە جا ستەمکاربوو یان ستەملێکراو، پیاوێك گووتی: ئەی پێغەمبەر ستەملێکراو

سەردەخەم، ئەی ئەگەر ستەمکار بێت چۆن سەری بخەم؟ گووتی: ڕێگری ستەمی لێدەکەی ئەوە سەرخستنیەتی) [بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە]، ئەوە واجب تر دەبێت لەسەر سەربازەکانی دەوڵەتی ئیسلامی کەوا هەڵگری ئەو ڕاسپاردەن کەوا وەلیی ئەمرەکان پێیان سپاردوون بە یارمەتی دانی براکانیان کە ڕاسپێردراون بە بەدواداچوونی سکاڵاکان لە کردارەکانیان.

لە گرنگی ڕێگرتن لە ستەم کردن پێویستی کرد کەوا لایەنی تایبەت بۆ ئەم کارە دابندرێت، دەوڵەتی ئیسلامی -تەنها بە فەزڵی الله- نوسینگەکانی بەدواداچوونی دیوانی دادگا و سکاڵا، ونوسینگەکانی ستەم لە هەموو ویلایەتەکانی دەوڵەتی ئیسلامی ئەمیرەکانی دەوڵەتی ئیسلامی ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی دەکەن، بەجۆرێك کە شەکوای سەرباز و ئەمیرەکانی ژێر دەسەڵاتی والی بگات بەسەرەوەی والی، هەروەك نوسینگەی بەدواداچوونی سکاڵا دامەزراوە وەك لایەنێکی سەربەخۆی تایبەت بەم کارە، وە هەموو لایەنەکانی تر لەگەڵ یەکتر کاردەکەن بۆ بەدواداچوون لەم دۆسیانەی کەوا گومانی ئەوەی لێدەکرێت کەوا ستەم بێت، وە بەدواداچوونی تا بەرزکردنەوەی سکاڵاکە ئەگەر ستەمی تێدا بوو.

## ئامانج چیە لە چەند لایەنی بۆ بەدواداچوونی سکاڵاکان؟

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (هەمووتان سەرپەرشتیارن وبەرپرسن لە ژێردەستەکانتان) [بوخاری وموسلیم گێڕاویەتیەوە]، هەر یەکێك ئەگەر کارێکی موسڵمانانی پێ بسپێرێت واجبە لەسەری کەوا ڕێگری بکات لە ستەم کردن لە ژێر دەستەکانی، ئەگەر شتێکی لەوبابەتەدا پێگەیشت پێویستە کەوا هەوڵ بدا بۆ لابردنی ستەم لەسەریان.

لەبەر ئەوەیە کەوا چەند لایەنە هەیە بۆ لادانی ستەم لە دەوڵەتی ئیسلامی، بەجۆرێك کەوا بۆ هاوڵاتیانی دەوڵەتی ئیسلامی و سەربازەکانی بێت لە ویلایەتەکان کەوا ستەمیان لێدەکرێت لە لایەن ئەمیرەکان، وە کراوەیە بۆئەوانەی دۆسیەیان لە دادگاکان هەیە کە سکاڵاکە بەرزکەنەوە بۆ دیوانی دادگا لەسەر فەرمانی دادوەر، بۆ دوبارە لێکدانەوەی ئەو حوکمانە، وە کراوەیە بۆ گشت موسڵمانان لە خاکی ئیسلام کەوا سکاڵا بەرزکەنەوە لەسەر ئەمیرەکان یان ئەمیری دیوانەکان یان ئەمیرە سەربازیەکان، یان سکاڵا بەرزکەنەوە لەسەر فەرمانە ئیداریەکانی سەر بە دیوانە جیاوازەکان بۆ لێژنەی موفەوەزەی سەر بە پێشەوای باوەڕداران -الله بیپارێزێت- کەوا لیژنەی موفەوەزە نوسینگەی ناوەندی بۆ بەدواداچوونی سکاڵاکان ڕاسپاردوە بۆ ئەم کارە.

هەر بەم شێوەیە دەبین -بەویستی الله- توانای خۆمان دەبەخشین بۆ کردنەوەی بواری زیاتر بەرامبەر خەڵکی بۆ پێشکەش کردنی سکاڵا دژی هەر کەسێك بێت یان هەر لایەنێك بێت لە دەوڵەتی ئیسلامی، وە ئەو ڕێگرانەمان لابردوە کەوا دەبنە هۆی تەواو نەکردنی شەکواکانیان بە بیانوی ئەوەی کە ئەو لایەنەی سکاڵاکەی بۆ بەرزدەکرێتەوە تایبەت نیە بەم دۆسیەیە، یان نەبوونی دەسەڵات لەسەر سکاڵاکەر لەسەری.

## مامەڵەکردنی نوسینگە چۆن دەبێت بۆ بەدواداچوونی ئەو سکاڵایانەی کەوا بۆیان بەرز کراوەتەوە؟

دوای پێشوازی کردن لە شەکواکان و تۆمارکردنی لەلامان، ئەگەر هەست بکرێت کەوا ئەو دۆسیەیە ستەمی تێدابێت هەروەك خاوەنی دۆسیەکە بانگەشەی دەکات ڕاستەوخۆ بەدواداچوونی بۆ دەکەین، ئەگەر نا ڕاستەوخۆ ڕەت دەکرێتەوە.

پاشان سەیری دۆسیەکە دەکرێت، ئەگەر کارەکە پەیوەست بێت بە ژێردەستەکانی والی و ئەمیری دیوانەکان، ئەوە ئەو دۆسیەیە بۆ شوێنەکانی خۆیان بەرزدەکرێنەوە بۆ وردبوونەوە تێیدا و گەڕاندنەوەی ئەنجامی لێکۆڵینەوە بۆ نوسینگە بۆ پێداچوونەوەی دۆسیەکە سەر لەنوێ، ئەگەر لێکۆڵینەوەکە بەگوێرەی پێویست بێت، و حوکمەکە گونجاو بێت، ئەوە حوکمەکە جێبەجێدەکرێت، وە ئەگەر کەم و کورتی هەبێت لە لێکۆڵینەوە، یان حوکمەکە گونجاو نەبێت ئەوە دوبارە چاوپێداخشانەوەی بۆ دەکرێت سەر لە نوێ، کاری ئێمە لەم حاڵەتەدا بەدواداچوون دەبێت بۆ دۆسیەکە بە شێوازێکی بەردەوام، لەبەر گرێنتی چاوخشاندن تێیدا و پەلەکردن لە

یەکلاکردنەوەی سکاڵاکە.

بەڵام ئەگەر دۆسیەکە تایبەت بێت بە حوکمی دادگا ئەوە ئێمە بەرزی دەکەینەوە بۆ دیوانی دادگا لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە قسەمان دەبێت لە دۆسیەکە لەگەڵ برایانی دادوەر، بۆ چاوخشاندن بە دۆسیەکە، وە کاری ئێمە بەهەمان شێوە بەدواداچوونی بەردەوامە، بۆ گرێنتی پەلەکردن لە یەکلاکردنەوەی دۆسیەکە.

بەڵام ئەگەر دۆسیەکە پەیوەست بێت بەیەکێك لە براکانی ئەمیر یان ئەمیری دیوانەکان، یان دژی دەستەیەك لە دەستەکانی دەوڵەتی ئیسلامی ئەوە ئێمە بەشداری دۆسیەکە دەکەین، بانگی داواکار دەکەین، یان ئەو کەسەی کەوا هەڵدەستێت بە لێکۆڵینەوە لەشوێنی داواکار بۆ دۆسیەکە، و گوێگرتن لە بەرگری لەخۆیان لەسەر فەرمانی داواکار لەسەریان، پاشان حوکم لەسەر دۆسیەکە دەکرێت، بە گەڕاندنەوەی ستەمەکە ئەگەر هەبوو، یان سزادانی ستەمکار و تەمێ کردنی، یان ڕەتکردنەوەی دۆسیەکە ئەگەر پێچەوانەی بانگەشەی داواکار دەرچوو.

**لەوتەکاندا باسی ئەو دۆسیانەت کرد کە بەدواداچوونی بۆدەکەن ئەگەر هەست کرا ستەمی تێدایە، مەبەستتان چیە لەمە؟**

بۆ ئەوەی فەرمانەکەت جوانتر بۆ دیاربێت دوو نمونەت بۆ دەهێنمەوە لەمیانی جیاکردنەوەیان بۆت دەردەکەوێت، یەکەم: ئەمیرێك هەڵدەستێت بە گواستنەوەی سەربازێك لە سەربازەکانی بۆ شوێنێکی تر لەبەر پێویستی ئەو شوێنە بەم برایە، بۆ پڕ کردنەوەی سەنگەر یان پێوستیان بەم برایە لەبەر پسپۆڕی ئەم برایە یان شتێك لەم شێوەیە، وە سەربازەکە ئەوە بە ستەم دابنێت لەبەر ئەوەی دور دەکەوێتەوە لە خانەوادەکەی و شوێنی نیشتەجێبوونی، دووەم: ئەمیرێك هەڵدەستێت بە گواستنەوەی یەکێك لەسەربازەکانی ژێر فەرمانی بۆ شوینێکی تر وەکو تەمێ کردنی یان گوێ پێنەدانی یان بەهەڵە یان بۆ دورکەوتنەوە لە خراپەیەك کەوا ئەمیر وای دەبینێت، وە سەربازەکە ئەوە بەسزا دادەنێت، لەبەر ئەوەی ئەم تەمێ کردنەکە ڕێك ناکەوێت لەگەڵ ئەو هەڵەی کە کردوویەتی، یان لەبەر ئەوەی پێی وایە لەبنەڕەتەوە هەڵەی نەکردوە.

لە حاڵەتی یەکەمدا ستەم نابینریت لە دۆسیەکە لەبەر ئەوەی لە حەقی ئەمیردایە کەوا سەربازی خۆیی بگوازێتەوە ئەگەر داوای لێبکرێت، وە لەسەر سەربازەکە گوێڕایەڵی و گوێگری هەیە لەوبوارەدا، بەڵام لە حاڵەتی دووەم ستەم دەبینرێت، وە لەم کاتەدا دەچین کار لەسەر دۆسیەکە دەکەین تا بگەین بە ڕاستی ستەمەکە و لایدەدەین بەویستی الله.

وە لەمیانەی بەدواداچوونمان بۆ سەدان دۆسیە





لەسەرەتای دامەزراندنمانەوە بینیمان کەوا نزیکەی نیوەی سکاڵاکان لە شوێنی خۆیان نین، بەڵکو دەکرێت ناوبنرێت بە شەکوا و نارەزایی، ئەو دۆسیانەی کەوا زانیمان لە شوێنی خۆیەتی کارمان بۆی کردوە، والحمد لله، وە یەکلامان کردوەتەوە لەماوەیەکی کەم، یان بە بەرزکردنەوەی ستەمەکە ئەگەر هەبوو، و لێپرسینەوە لە ستەمکار، وە یان بەیانێك دەردەچێت بۆ داواکار ئەگەر داواکراو هیچی لەسەر نەبوو.

**ئایا کاری تر لەسەرشانی نوسینگە هەیە؟**

بەڵێ، بە فەزڵی الله لەوێ چەند لیژنەیەك هەیە کە سەر بە نوسینگەیە، دەگەڕێت بەسەر بەندینخانە جیاوازەکانی دەوڵەتی ئیسلامی بۆ ئەوەی چاوپێکەوتن بکات لەگەڵ بەندکراوەکان، بۆ سەیرکردنی حاڵیان و گەیاندنی سکاڵایان ئەگەر هەیان بوو، وە لیژنەی تر هەڵدەستێت بە گەڕان بەسەر هێڵەکانی سەنگەرنشینی بۆ زانینی حاڵی سەربازەکان و سکاڵاکانیان، لەهەردوو حاڵەتدا دۆسیەکان بەرزدەکرێنەوە بۆ نوسینگەی ناوەندی بۆ بەدواداچوونی ئەو دۆسیانە ئەگەر زانرا جێگای بایەخە.

لەگەڵ چاوپێکەوتنی شێخەکانی خێڵەکایەتی وکەسە دیارەکان بۆ گوێگرتن لە شەکواکانیان وبەرزکردنەوەیان بۆ وەلی ئەمرەکان.

**هیچ وتەیەکت هەیە لە کۆتایی چاوپێکەوتنەکە؟**

وەسیەتی موسڵمانان بەگشتی و سەربازانی دەوڵەتی ئیسلامی بەتایبەتی دەکەم کە ستەم نەکەن، وە با هەموان بزانن کەوا ستەم خراپە، وە تاریکیەیە لەڕۆژی دوایی هەروەکو پێغەمبەر ﷺ باسی کردوە.

ئەگەر کەسێك ستەمی لیکرا لەلایەن براکەی و ویستی مافی خۆی بەدەست بهێنێت، ئەوە دەرگاکانی براکانی کراوەن لە نوسینگەی ناوەندی بۆ بەدواداچوونی سکاڵاکان و تەواوی نوسینگە راسپێردراوەکان بەم کارە کراوەن بەڕویدا، با سکاڵاکەی بەرزکاتەوە بۆمان، ئەگەر مافی خۆی بوو ئەوە مافەکەی بۆ دەگەڕێنینەوە لەو کەسەی کەوا ستەمی لێکردوە، ئەگەر لەخۆشەویستترین کەسیش بێت لامان، وە گرنگی بە گلەی گلەیکار نادەین، بەویستی الله.

هەر کەسێك دەزانێت کەوا ستەمی کردوە با لە الله بترسێت و پەلە بکات لە تەوبەکردن و گەڕاندنەوەی مافەکە بۆ خاوەنەکەی، و داوای لێخۆشبوونی لێبکات لەو ستەمەی کە کردویەتی.

وە ئەوەی دەزانێت کەوا کەسێك ستەمی لێکراوە و پێمان نەگەیشتوە، با یارمەتی ستەملێکراوەکە بدات بە بەرزکردنەوەی سکاڵاکەی بۆ لای ئێمە، لەبەر ئەوەی کەسانی لاواز هەن، وە کەسانێك هەن کە نازانن چۆن سکاڵاکانیان بەرزبکەنەوە، وە چۆن داوای مافی خۆیان بکەن، ئەگەر ئەو سکاڵایە پێمان گەیشت ئەوە دەگات بە وەلی ئەمرەکان، ئەوە ئەو کەسە بێتاوان دەبێت بەرامبەر الله بە یارمەتی دانی ستەملێکراو، وە هەر کەسێك بێدەنگ بوو لە ستەمێك کەوا دەیزانی -بەنەگەیاندنی دۆسیەکە بۆلامان- ئەوە یارمەتی ستەمکاری داوە بە بێدەنگیەکەی، وە تاوانەکەی گەورەترە لە ستەم.

داوا لە الله دەکەین کەوا حاڵمان چاك بکات و کۆتاییمان باش بکات، ئەو بەتوانایە بۆ ئەم کارە، وصلى الله وسلم على نبينا محمد، والحمد لله رب العالمين.

# گەورەیی دە ڕۆژی ذو الحجة

## وبەندایەتییـە هاتووەکان تێیدا



**گەورەیی ١٠ ڕۆژی ذو الحجه وبەندایەتییە هاتووەکان تێیدا**

چەند ڕۆژێکی کەمی تر پێشوازی لە وەرزێکی گەورە لەوەرزەکانی بەندایەتییەکان ئەکەین، کە ئەویش ١٠ ڕۆژی سەرەتای مانگی حەڕامی ذی الحجەیە، ئەو ڕۆژانەی کەچاکترین ڕۆژەکانی ساڵن لەلای الله تعالی، وە الله ﷻ هەندێک بەندایەتی بۆمان بەشەرع داناوە بۆئەوەی فریای لەدەستچووەکانمان بکەوین لەوەی کە کەمتەرخەمیمان کردووە لەبەندایەتییەکان، کەواتە پلەوپایەی ئەم ١٠ڕۆژە چییە؟ فەزڵ وگەورەیی چییە؟ وگرنگترین بەندایەتییەکان چیین کەلەم ڕۆژانەدا بەشەرع دانراوە؟

**فەزڵ وگەورەیی ١٠ڕۆژی سەرەتای مانگی ذی الحجە:** بۆڕوونکردنەوەی فەزڵ وگەورەیی ئەو ١٠ڕۆژە بەڕێزە هەرئەوەندە بەس بێت کە الله ﷻ سوێندی پێ ئەبات کە ئەفەرموویت: {وَالْفَجْرِ * وَلَيَالٍ عَشْرٍ} [الفجر: ١-٢]، ئیبن کەثیر دەڵێت: «سوێند بە ١٠ڕۆژەکە مەبەست تێیدا: ١٠ڕۆژەکەی مانگی ذی الحجەیە، هەروەک ئەمە وتراوە لەلایەن ئیبن عەباس وئیبن زوبەیر وموجاهید وزیاتر لەکەسێک لەپێشینان وپاشینان»، وبۆی زیاددەکەم کە الله ﷻ سوێند بەهیچ شتێک نابات ئیلا شتی گەورە! ئیبن قەییم دەڵێت: «کاتی خواستراو بۆهاوشێوەی ئەم کردەوانە ئەوا شایستەی ئەوەیە پەروەردگار ﷻ سوێندی پێ ببات» [التبیان].

هەروەک پێغەمبەر ﷺ روونیکردەوە کەئەم ١٠ڕۆژەی سەرەتای مانگی ذی الحجە چاکترین ڕۆژەکانی دونیان، وکردەوەی چاکە تێیدا چاکترە لەهەموو کردەوەیەک لەجگە لەو ڕۆژانە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (هیچ ڕۆژێک نییە کردەوەی چاکە تێیدا خۆشەویستتر بێت لای الله لەئەم ڕۆژانە، [واتە ١٠ڕۆژەکە]) ووتیان: ئەی پەیامبەری الله، تەنانەت جیهاد لەپێناو الله پێی ناگات؟ فەرمووی: (تەنانەت جیهاد لەپێناو الله پێی ناگات، جگە لەپیاوێک بەخۆی وماڵی دەرچوبێت وبەهیچیان نەگەڕێتەوە) [رواه البخاري].

ئیبن ڕەجەبی حەنبەلی دەڵێت «ئەم فەرموودەیە ئەبێتە بەڵگە لەسەرئەوەی کە کردەوە لەو ڕۆژانەدا -مەبەستی لە ١٠ڕۆژەکەیە- خۆشەویستترە لەلای الله لەکردەوە لەڕۆژەکانی دیکەی دونیا بەبێ جیاکردنەوەی هیچ ڕۆژێک تێیدا، ومادەم خۆشەویستترە لەلای الله کەواتە باشترە لەلای الله» [لطائف المعارف].

ئیبن قەییم دەڵێت: «١٠ڕۆژی ذی الحجە باشتر کراوە بەهۆی ڕۆژەکانی؛ چونکە ڕۆژی قوربانیکردن وڕۆژی عەرەفە وڕۆژی تەرویەی تێدایە» [زاد المعاد].

لەم ١٠ڕۆژەدا ڕۆژێکی گەورە هەیە لەلای الله، کەئەویش ڕۆژی عەرەفەیە، ڕۆژی شایەتی بۆدراو، کەتێیدا الله ئایینەکەی تەواوکرد، وڕۆژووگرتن تێیدا تاوانی دووساڵ ئەسڕێتەوە، وەهەروەها ڕۆژی قوربانیکردنی تێدایە، کە ئەمیش گەورەترین ڕۆژەکانی ساڵە، ڕۆژی حەجی گەورە کەتێیدا طاعەت وبەندایەتییەکان کۆدەبنەوە بەجۆرێک لەڕۆژەکانی تردا کۆنابنەوە.

گرنگترین بەندایەتییەکانی ١٠ڕۆژی ذی الحجە: بەڕاستی گەیشتن بەم ١٠ڕۆژە نیعمەتێکی

گەورەیە لەنیعمەتەکانی الله تعالى بەسەر بەندەکانیدا، کەس بەئەندازەی خۆی حەقەکەی نادات جگە لەبەندەکارە موجتەهیدەکان، کەواتە ئەرکە لەسەر موسڵمان کەهەست بەم نیعمەتە بکات وئەم هەلە بقۆزێتەوە، چونکە پێشین بەجۆرێک ئیجتیهادیان دەکرد لەبەندایەتی کردن لەم ڕۆژانەدا کەپێشتر بەو جۆرە نەیاندەکرد، هەروەک ڕوونە لەژیاننەمە پاکەکەیاندا.
وە کردەوەی چاکە کەپێویستە لەسەر موسڵمان خووی پێوەبگرێ لەم ڕۆژانەدا زۆر زۆرن، وەکو جیهاد لەپێناو الله، وخوێندنەوەی قورئان، وپاراستنی نوێژەکانی بەکۆمەڵ لەمزگەوت، وچاکەکردن لەگەڵ دایک وباوک، وسیلەی ڕەحم، وچاکەکردن لەگەڵ دراوسێ، وچاکەکردن لەنێو خەڵکیدا، وڕێزگرتن لەمیوان، وبەخشین لەپێناو الله، وسەردانیکردنی نەخۆش... هتد.

بەڵام هەندێک کردەوەی دیاریکراو هەیە کەتایبەتمەندی دراوەتێ لەم ڕۆژانەدا، ئەوانیش:
١. زۆر زیکرکردن: الله تعالى ئەفەرمووێت: {لِيَشْهَدُوا مَنَافِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ فِي أَيَّامٍ مَعْلُومَاتٍ} [الحج: ٢٨]، ئیبن ڕەجەب دەڵێت: «کۆدەنگی زانایان لەسەرئەوەن کە [الأيام المعلومات] بریتییە لە: ١٠ڕۆژی ذی الحجه» [ اللطائف ].

هەربۆیە پێغەمبەر ﷺ هانمان دەدات لەم ڕۆژانەدا زۆر تەهلیل[لا إله إلا الله] وتەکبیر[الله اكبر] وتەحمید[الحمد لله]بڵێین، هەروەک دەفەرمووێت ﷺ: (هیچ ڕۆژانێک کردەوەکان تێیدا گەورەتر وخۆشەویستتر نیین لەلای الله لەم ١٠ڕۆژە، دەسا تەهلیل وتەکبیر وتەحمید زۆربکەن تێیدا) [رواه أحمد وغيره].

بوخاری لەسەحیحەکەیدا دەڵێت: «عومەر رضي الله عنه تەکبیری دەکرد لەگومەزەکەی خۆی لە»مەننا»، خەڵکی ناو مزگەوتەکەش ئەیانبیست، وتەکبیریان دەکردەوە، وخەڵکی ناو بازاڕیش تەکبیریان ئەکردەوە، هەتا «مەننا» ئەلەرزایەوە لەتەکبیرات، وئیبن عومەر تەکبیراتی دەکرد لە»مەننا» لەو ڕۆژانەدا ولەپاش نوێژەکان ولەسەر جێگای خۆی ولەناو خێمەکەی ولەدانیشتنی وڕێکردنی، لەسەرجەم ئەو ڕۆژانە».

کەواتە، لەتایبەتمەندترین کردەوە سوننەتییەکان لەم ١٠ڕۆژەدا تەکبیراتە، ئەمیش لێرەدا دوو جۆرە: تەکبیراتی ئازاد وتەکبیراتی مەرجدار، ئەمما ئازاد ئەوا لەهەموو کاتێکدایە لەیەکەم ١٠ڕۆژەکەوە هەتا کۆتا ڕۆژەکانی»تەشریق»، ئەمما تەکبیراتی مەرجدار ئەمەیان مەرجەکەی ئەوەیە تەنها لەپاش پێنج نوێژەکە ئەکرێت(لەپاش سەلام دانەوە لەنوێژە فەڕزەکان)، ودەست پێدەکات لەخۆرهەڵاتنی ڕۆژی عەرەفە -بۆ جگەلە حەجاجەکان- هەتا عەسری کۆتا ڕۆژەکانی «تەشریق»، هەروەک لەهەندێ لەهاوەڵەکانەوە هاتووە، ئەمما حەجاجەکان تەکبیراتیان دەست پێدەکات لەوکاتەوە کە»جمرة العقبة» فڕێئەدەن لەڕۆژی جەژن. وشێوازی تەکبیراتەکەش بەم جۆرەیە: ((الله أكبر، الله أكبر، لا إله إلا الله، والله أكبر، الله أكبر، ولله الحمد)، هەروەها لەئاثاردا شێوازی دیکەش هاتووە.

٢. ڕۆژووگرتن: سوننەتە موسڵمان نۆ ڕۆژی سەرەتای ذی الحجه بەڕۆژووبێت (گشتی یان هەرچەند لەتوانایدا بوو)، لەهەندێ لەخێزانەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ دەڵێت: «پەیامبەری الله ﷺ نۆی ذی الحجه بەڕۆژوو ئەبوو» [رواه أبو داود]، زۆربەی زانایان لەسەرئەوەن کەڕۆژووی نۆ ڕۆژی ذی الحجه موستەحەبە بەڵکو زۆرزۆر موستەحەبە [شرح صحيح مسلم للنووي].

٣. قوربانیکردن: یەکێک لەکردەوەکانی ئەم ١٠ڕۆژە نزیکبوونەوەیە لە الله تعالى بەقوربانیکردن، قوربانیکردن سوننەتێکی موئەکەدەیە لەلای جمهوری فوقەهاکان، کەواتە پێویستە لەسەر موسڵمانی بەتوانا کەمتەرخەم نەبێت تێیدا، لەبەرئەوەی پەیامبەری الله ﷺ بەردەوام بووە لەسەری، هەروەها هاوەڵەکانی رضي الله عنهم لەدووای خۆی.

لەئیبن عومەرەوە رضي الله عنهما دەڵێت: «پەیامبەری الله ﷺ دەساڵ لەمەدینە نیشتەجێ بوو بەردەوام قوربانی ئەکرد» [رواه الترمذي وحسنه]، ئیبن قەییم دەڵێت: «پێغەمبەر ﷺ دەستبەرداری قوربانیکردن نەبووە» [زاد المعاد].

٤. حەج وعەمرە: بەڕاستی چاکترین کردەوە بەندە

ئەنجامی بدات لەم ١٠ڕۆژە پیرۆزە حەجکردنی ماڵی حەرامی اللەیە ئەگەر لەتوانایدابێت، هەرکەسێ الله تعالى مۆفەقی بکات بۆحەجی ماڵەکەی ونوسوکەکانی جێبەجێبکات بەشێوازی داواکراو؛ ئەوا بەشی هەیە لەفەرموودەی پێغەمبەرەکەی ﷺ: (عەمرە بۆ عەمرە تاوانەکانی نێوانیان ئەسڕێتەوە، وحەجی مەبڕور هیچ پاداشتێکی نییە جگە لەبەهەشت) [متفق علیە].

داواکارین لە الله تعالى کەجێنشینبوون ببەخشێ بەموجاهیدانی دەوڵەتی ئیسلامی، وکۆتی زیندانی مەککە ومەدینە بکەنەوە لەدەستی طاغووتەکانی ئالی سەلول، الله ڕیسوایان بکات، وە الله ﷻ ڕزقمان بدات حەج وعەمرە لەژێر سایەی حوکمی شەریعەت.

جگە لەوە، ڕەنگە کەسێک بپرسێ: چۆن کۆکردنەوە بکەین لەنێوان فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کەتێیدا کردەوەی لە ١٠ڕۆژی ذی الحجەی بەباشتر داناوە بەسەر سەرجەم کردەوەکانی تر، ولەگەڵ فەرمووودە زۆرە موتەواتیرەکان کەئەیسەلمێنن جیهاد لەپێناو الله باشترە لەسەر سەراپای کردەوەکان.

وەکراوە بەچڵەپۆپەی ئیسلام؟! وەکو فەرموودەی ئەبو هورەیرە ﵁ کەتێیدا پرسیارکرا لەپێغەمبەر ﷺ: «باشترین کردەوە چییە؟» وەڵامی دایەوە: (ئیمان هێنان بە الله وپێگەمبەرەکەی)، ووترا: «پاشان چیتر؟» فەرمووی: (جیهاد لەپێناو الله) [متفق علیە].

بۆکۆکردنەوە لەنێوان ئەم دەقانە خاوەنی «فیض الباري» دەڵێت: «ئەمە هەمووی لەکاتێکدایە کەجیهاد فەڕز نەبێت، چونکە قسە لەسەر باشترینە نەک فەڕزترین»، وئیبن ڕەجەب دەڵێت: «فەڕزەکانی ١٠ڕۆژی ذی الحجە باشترە لەفەڕزەکانی سەرجەم ڕۆژانی تر، وسوننەتەکانی باشترە لەسوننەتی ڕۆژەکانی تر، ئەمما سوننەتەکانی ١٠ڕۆژەکە چاکتر نییە لەفەڕزەکانی ڕۆژەکانی تر... بەم جۆرە ڕۆژووی ١٠ڕۆژی مانگی ڕەمەزان چاکترە لەڕۆژووی ١٠ڕۆژی ذی الحجە، لەبەرئەوەی فەڕز چاکترە لەسوننەت» [فتح الباري].

ئەوەی کە بڕیاری لەسەردراوە لای ئەهلی علم ئەوەیە کەجیهاد -هەرچەندە ئەگەر جیهادی «طلب»یش بێت چاکترین تاعەتەکانە، وهەرگیز هیچ شتێک یەکسانی نابێتەوە، شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە دەڵێت: «زانایان ڕێککەوتون -ئەوەندەی من بزانم- لەسەرئەوەی کەهیچ کردەوەیەکی خۆبەخشانە(تطوعات) چاکترنییە لەجیهاد، چونکە جیهاد باشترە لەحەج کە[التطوع]ە، وچاکترە لەڕۆژووی خۆبەخشانە [تطوع]، وچاکترە لەنوێژی خۆبەخشانە [تطوع]» [مجموع الفتاوی].

چ جا ئەگەر جیهادەکە جیهادی «دفع»ی موتەعەیین بێت لەسەر هەموو موسڵمانێک هەروەک حاڵی ئێستا؟! ئیبن تەیمییە دەربارەی جیهادی دەفعی تەتار دەڵێت: تەنانەت بە الله ئەگەر دەستپێشخەرە یەکەمەکان لەموهاجیر وئەنسارەکان.

وەکو ئەبو بەکر وعومەر وعثمان وعەلی وجگە لەوان، ئامادەبوونایە لەم سەردەمە ئەوا یەکێک لەچاکترین کردەوەکانیان جیهادی ئەو گەلە تاوانبارانە ئەبوو» [مجموع الفتاوی].

ئەوا چاکترە لەهەموو بەندایەتییەکان (واجبەکان وموستەحبەکانیش)، وئەگەر جیهاد فەڕزی کیفایەت بێت (هەروەک جیهادی طلب) وبکەوێتە ناو ١٠ی ذی الحجە؛ ئەوا دەبێتە باشترین خۆبەشین «تطوع» کەبەندە پێشکەشی بکات.

کەواتە غەنیمەت بگرن ئەی موسڵمانان غەنیمەت لەم ڕۆژە گەورانەدا، چونکە ئەمە بە الله نانرخێندرێ، دەستپێشخەری بکەن لەکردەوە دەستپێشخەری، پەلەبکەن لەپێش هێرشی ئەجەل بۆسەرتان پەلەبکەن، چونکە ئەمرۆ کردەوە بەبێ ژماردنە، وسبەینێ ژماردن بەبێ کردەوەیە. پەروەردگار بمانگەیەنە بە ١٠ی ذی الحجە، ویارمەتیمان بدە لەسەر زیکرکردن وسوپاسکردنت وچاکترین بەندایەتیت.

# ده له مانگی ذي الحجة

الله تعالى دەفەرموێت:

﴿وَالْفَجْرِ * وَلَيَالٍ عَشْرٍ * وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ﴾

سورەتی فەجر

## گەورەیی

لە ئیبن و عەباسەوە الله لێی ڕازی بێت لە ڕەسول الله صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (چ کردارێك لەو ڕۆژانە باشترە)، ووتیان: جیهادیش؟ فەرمووی: (جیهادیش، مەگەر پیاوێك دەرچێت بەماڵ و گیان و، بەهیچیش نەگەڕێتەوە).

بوخاری گێڕاویەتیەوە

## کردارو ئادابە سوننەتەکان تێیدا

### ڕۆژوی نۆ ڕۆژەکە

لە هەندێك لە خێزانەکانی الله لێیان ڕازی بێت فەرموویانە: پێغەمبەر نۆ ڕۆژی ذي الحجة بەڕۆژوو دەبوو.

أبو داود گێڕاویەتیەوە

### ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە

لە ئەبو قەتادەی ئەنصاری: لە پێغەمبەر پرسیاری ڕۆژوی عەرەفە کرا، وتی: (لێخۆش بوونی ساڵێکە لە پێش و لە پاش).

مسلم گێڕاویەتیەوە

### قوربانی

لە ئەنەسەوە گووتی: پێغەمبەرم بینی دوو بەرانی باشی کردە قوربانی، بینیم هەردوو پێی لەسەر هەردوو لای بسم الله ی کردو سەری بڕین بەدەستی خۆی.

مسلم گێڕاویەتیەوە

### کردنی الحمد لله و الله اكبر و سبحان

لە ئیبن عومەرەوە لە پێغەمبەرەوە فەرمووی: (هێچ ڕۆژانێك لای الله وە خۆشەویستر نین لەو ١٠ ڕۆژە، زۆر الله اكبر و الحمد لله بکەن).

ئەحمەد گێڕاویەتیەوە

### گشت کردارە چاکەکان

هەر کارێك کە لە الله ت نزیك بکاتەوە لەبەر گشتگیری وتەی پێغەمبەر(کرداری چاك تێیدا خۆشەویسترە لای الله) غەزوە و ڕیبات و زیکر و نوێژ و قورئان خوێندن و سەردانی خزمان و بەخشین...هتد.

### بابەت

حوکمی دەست گرتنەوە لە قژو نینۆك بۆ ئەوەی کەوا دەیەوێت قوربانی کات؟

واجب،بۆ فەرموودەکە: لە دایکی سەلەمەوە، پێغەمبەر دەفەرمووێت: ئەگەر مانگتان بینی لە ذي الحجة، وەیەکێکتان ویستی قوربانی بکا، با نینۆك قژی نەکات.

مسلم گێڕاویەتیەوە

### بابەت

داڕشتنی الله اكبر کردن لەو چەند ڕۆژەدا:

- اللّه أكبر، اللّه أكبر، اللّه أكبر.
- اللّه أكبر، اللّه أكبر، لا إله إلا اللّه، واللّه أكبر، اللّه أكبر، ولله الحمد.
- اللّه أكبر كبيرا، اللّه أكبر كبيرا، اللّه أكبر وأجلّ، اللّه أكبر، ولله الحمد.

# ئەی کۆمەڵی ئافرەتان

# ماڵ ببەخشن

-الله تەعالا- کوشتاری فەرز کردووە لەسەر بەندەکانی بەڵام جگە لە ئافرەتان، کەچی زۆربەی ئافرەتان -ئافرەتانی سەردەمی خۆمان- وایانزانی کە بەهیچ جۆرێک جیهاد لەسەریان نەنوسراوە، لەبیریانکرد کەهێشتا جۆری تر لە جیهاد ماوە لەسەریان کە جیهادی گەورەن، کە -الله- پێشی خستووە بەسەر جیهادی نەفس لەگشت شوێنەکان لە قورئانی پیرۆزدا، تەنها لەیەک شوێن نەبێت؛ کەئەویش جیهادە بە ماڵ وسامان، کە ئەم جیهادە هێشتا فەرزکراوە وحەقێکە لەسەر ئافرەتان، هەروەک جیهادی شمشێر کە لە بنەڕەتدا لەسەریان نەنوسراوە، هەندێک لە ئافرەتانی پێشینان ﷺ ئەگەر هیچ ماڵێکی نەبوایە بیکاتە نەفەقە بۆ جەنگاوەرەکان ئەوا نینۆکیان ئەبڕی و ئەیانکرد بە ناڵ بۆ ئەسپی جەنگاوەران، دەسا ئافرەتە تێکۆشەرەکانی بەرزکردنەوەی ووشەی -الله- لەکوێن، خەرجی دەرانی ئافرەتان لەکوێن لەپێناو سەرکەوتنی ئەم دینە؟ پاداشتیش بەهەشتێکە پانیەکەی ئەوەندەی ئاسمانەکان و زەوییە، بەئیزنی الله.

الله تەعالا لە کتێبە پیرۆزەکەیدا دەفەرموێت: {ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە، ئایا بازرگانیەکتان پێ نیشاندەم کە ڕزگارتان دەکات لە سزایەکی ئازاربەخش * ئیمان بهێنن بە -الله- و پێغەمبەرەکەی و جیهاد بکەن لەپێناو -الله- بە ماڵ و نەفستان ئەوە چاکترە بۆتان ئەگەر بزانن} [الصف: ١٠-١١]، باوڕهێنان بە -الله تەعالا- پاشان جیهاد لەپێناویدا بە ماڵ و نەفس، جیهاد بە ماڵ لەپێشدا ماتووە چونکە بەو ماڵ خەرجکردنە ئامادەکردنی کەرەستە و ئامادەکردنی سووپا دەستپێدەکات، هەروەها جیهادی نەفس ئەهلی بیانووی تێدایە ئەوانەی کە تاوانبار نابن ئەگەر ئەنجامی نەدەن، ئافرەتیش یەکێکە لە بیانووەکان،

بەڵام جیهادی ماڵ بۆ کەس بیانووی تێدا نیە لەوانەی کە -الله- دوڵەمەندی کردوون بە فەزلی خۆی و دوادەکەون، جیاوازی تێیدا نیە لە ژن و پیاو، و لە پیر وگەنج، و لە نابینا و بینەر، و لە پەککەوتە و لەشساغ، بەڵام هەژار تاوانبار نابێت تێیدا هەروەک -الله تەعالا- دەفەرموێت: {لەسەر ئەوانەش نیە، کە کاتێک دێنە لات -ئەی موحەمەد ﷺ وپێیان دەڵێیت هیچ شوێنێکتان بۆ نادۆزمەوە هەتا لەگەڵ خۆمتان ببەم} [التوبة: ٩٢]، ئەنەس ﷺ ئەگێڕێتەوە -کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (جیهادی ماوەڵگەڕان بکەن بە ماڵ ونەفس وزمانتان) [أبو داود ڕیوایەتی کردووە].

ئیبن قەییمی جەوزیە ﷺ لەسەر حیکمەتی پێشخستنی جیهادی ماڵ بەسەر جیهادی

نەفس دا دەڵێت: «سوودی دووەم ئەوەیە کە ماڵ خۆشەویستی نەفسە و مەعشوقیەتی، کە نەفس خۆی دەکاتە قوربانی ماڵ، وخۆی ئەکاتە مەترسییەوە و ڕەنگە تووشی مەرگ ببێتەوە لەپێناویدا، ئەمەش بەڵگەیە کە خۆشەویستیەتی، هەربۆیە -الله تعالا- موجاهیدە خۆشەویستەکانی بانگکرد بۆ خەرجکردنی خۆشەویستەکەیان واتە ماڵ لەپێناو ڕەزامەندی خۆیدا، چونکە پێویستە -الله- خۆشەویسترین بێت لەدڵیاندا، و نابێت شتێکیتر مەبێت خۆشەویستتر بێت لەدڵیاندا، چونکە ئەگەر خۆشەویستەکەیان کە ماڵە کردە قوربانی لەپێناو بەدەستهێنانی خۆشەویستی الله، ئەوا ئەگوازرێنەوە بۆ پلەیەکی بەرزتر وکامڵ تر، کەئەویش ئەوەیە نەفسی خۆیان بکەن بە قوربانی ئەمەش ئامانجی خۆشەویستیەکەیە» [صید الفوائد].

ئاشکرایە کە ئافرەتان -مەگەر ئەوانەی الله پاراستونی، ئەوانیش کەمن- زۆر بڵێی دەکەن و پیاوان لەخشتە ئەبەن وغەیبەت وهاوشێوەکانی لەتاوانە بەمیلاک چووەکان ئەکەن، هەربۆیە پێغەمبەر ﷺ ڕێگایەکی پێشاندان کە ئەبێتە هۆی لێخۆشبوونی بەشێک لە تاوانەکانیان لە دونیادا، لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە، کە دەڵێت: « پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ چێشتەنگاو یان بەربانگ لەمزگەوتەکەیاندا، تێپەڕبوو بەلای ئافرەتانێک، فەرمووی: (ئەی کۆمەڵی ئافرەتان ببەخشن، چونکە بینیم ئێوە زۆرترین ئەهلی ئاگر بوون) ووتیان: لەبەرچی ئەی پێغەمبەر؟ فەرمووی: (زۆر نەفرەت دەکەن، چاکەی پیاوەکانیان لەبەر چاو نیە...)» فەرموودە [بوخاری ڕیوایەتی کردووە].

ئەوەش ئەسمای کچی ئەبوبەکر رضي الله عنها سەرەڕای هەژاری و کەمدەرامەتی، ئەسماء کە ئاڵتوون و خشڵی نەبوو، پرسیاردەکات لەپێغەمبەر ﷺ دەربارەی صەدەقە، لە کوڕی ئەبو مەلیکەوە، کەدەڵێت: «ئەسمای کچی ئەبوبەکر بۆمی گێڕایەوە، فەرمووی:گووتم: ئەی پێغەمبەر، هیچم نیە جگە لەوەی زوبەیر هێنایە ماڵمەوە، ئایا لێی ببەخشم؟ فەرمووی: (لێی ببەخشە، و گیری مەکە، دواتر لەسەرت دەگیرێتەوە)» [ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە].

ئیبن حەجەر دەڵێت: «واتە نەهی کراوە لە نەبەخشینی صەدەقە لەترسی لەناوچوون، چونکە ئەوە یەکێکە لەگەورەترین هۆکار بۆ بڕینی بەرەکەت؛ چونکە -الله- پاداشتی بەخشەر دەداتەوە بەبێ ژماردن، و ئەوەی لەکاتی پاداشتدا بۆی نەژمێردرێت، ئەوا لەکاتی بەخشیندا لەسەری ناژمێردرێ، هەرکەسێکیش بزانێت کە -الله- ڕزقی دەدات بەجۆرێک نەتوانێ بیژمێرێت، ئەوا حەقێکە لەسەری ئەبێ ببەخشێ بێ حیساب» [فتح الباري].

چاکەکاران ماڵی خۆیان پێمان ئەبەخشن *
ئێمەش ماڵی چاکەکاران ئەبەخشینەوە

لە ئەبو هوڕەیرەوە رضي الله عنه دەڵێت: «پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (الله عز وجل صەدەقە وەردەگرێت، بە دەستی ڕاستی وەریدەگرێت، پاشان بۆتانی پەروەردە دەکات هەروەک ئێوە منداڵێکتان پەروەردە دەکەن، هەتا پاروویەک دەبێتە هاوشێوەی چیای ئوحود)» [ترمذی ڕیوایەتی کردووە].

ئەی چی ئەگەر ئەم صەدەقانە بۆ ئامادەکردنی موجاهیدان بێت لەپێناو -الله-؟ و کێ دین جێبەجێدەکات وپاکی ئیسلام دەپارێزێت جگە لە موجاهیدان؟ وکێ نامووس ئەپارێزێ و لووتی کوفر دەشکێنێ جگە لە موجاهیدان؟ بوخاری دەگێڕێتەوە لە «بەشی فەزڵی کەسێک جەنگاوەرێک ئامادە بکات یان ئەوانەی پشتی بە چاکی چاودێری بکات» لە زەیدی کوڕی خالدەوە رضي الله عنه کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (هەرکەسێ موجاهیدێک ئامادەبکات لەپێناو -الله- ئەوا -غەزا-ی ئەنجام داوە، هەرکەسێکیش ئەوانەی پشتی موجاهیدێک بەچاکی چاودێری بکات لەپێناو -الله- ئەوەش -غەزا-ی کردووە.

ئەمە بوو کە ئەمیری باوڕداران عوثمانی کوڕی عەفان رضي الله عنه لێی تێگەیشت وبازرگانی کرد لەگەڵ -الله- کە بووە هۆی دەستکەوتنی بەهەشتەکان بۆی، تەنها یەک جەنگاوەری ئامادە نەکرد، بەڵکو سووپایەکی تەواوی ئامادەکرد لە

غەزوەی تەبوك، کەئەویش سووپای -العسرة- بوو ئەگەر بزانی سووپای -العسرة-چی بوو، ئەو سووپایەی کە ناوی -العسرة- ی لێنرا چونکە لە ڕۆژانێکی تەنگ وکاتێکی سەختدا بوو لەسەر موسڵمانان،عبدالرحمن کوڕی سەمرە دەڵێت: عوثمان هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وهەزار دیناری هێنا لەکاتێکدا سوپای -العسرة- ی ئامادەکرد بڵاوەی پێیانکرد لەشوێنێکی خۆیدا، عبدالرحمان گووتی: پێغەمبەرم بینی ﷺ تەماشای دەکرد لەشوێنەکەدا و ئەیفەرموو: (لەدووای ئەمڕۆوە عوثمان هەرشتێک بکات زیانی پێناگات) دووجار ئەمەی فەرمووە. [ترمذی ڕیوایەتی کردووە].

بەڵکو شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە لە ووتارێکی فیقهی ئارامبەخشی دەروونیدا پلەوپایەی جیهادی ماڵمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە لەپێش گشت بەخشینێکەوەیە، ﵀ دەڵێت: «ئەگەر ماڵ کەم بۆوە بۆ تێرکردنی برسییەکان وجیهاد بە تەرکدانی بەخشین زیانی پێبگات، ئەوا جیهاد پێشدەخەین هەرچەندە برسییەکان بمرن، هەروەک لە بابەتی خۆکردنە ناو دوژمنەوە بەمەبەستی کوشتنیان(تترس)، لەوێدا بە کردەوەکانمان ئەیانکوژین، ولێرەدا بە کرداری الله ئەمرن» [الفتاوى الكبرى].

وە ئەگەر بڕوانینە حاڵی ئەمڕۆی بەشێک لە ئافرەتان، ئەبینین زیادە مەسرەف ئەکەن لە پێناو خۆشگوزەرانی دونیای لەناوچوو، هەر لە جلوبەرگ وخشڵ و خواردن و ئەوشتانە، لەبەرامبەریشدا ئەبینین ڕەزیلی و دەستگیری ئەکەن لەسەر دینی -الله- کە ئەو دەوڵەمەندە و ئێمە هەژارین: {هَاأَنْتُمْ هَؤُلَاءِ تُدْعَوْنَ لِتُنْفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَمِنْكُمْ مَنْ يَبْخَلُ وَمَنْ يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَنْ نَفْسِهِ وَاللَّهُ الْغَنِيُّ وَأَنْتُمُ الْفُقَرَاءُ وَإِنْ تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوا أَمْثَالَكُمْ} [محمد: ٣٨]،

**ئایا دەبێت ئافرەتێکی موسڵمان دەستبڵاو بێت لەبەر کاروباری دونیا، ودەستکورت بێت لەسەر ئەوەی کە سوودی دواڕۆژی هەیە بۆی؟**

وئایا کەس لەئافرەتان هەیە سەودەی خێزانی پێغەمبەر ودایکی ئیمانداران بکاتە پێشەوای خۆی؟ لە عائیشەوە ﵂: کە هەندێک لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ بەپێغەمبەریان گووت ﷺ: «کام لەئێمە زووتر پێت دەگات؟ فەرمووی: (دەست درێژترینتان)، ئینجا قامیشێکیان هێنا ،دەستیان دەپێوا، سەودە دەستی لەهەموویان درێژتربوو، دواتر زانیمان کە هۆکاری درێژی دەستی صەدەقە بوو، و لەهەمووماں خێراتر پێی ئەگەیشت، کە زۆر حەزی لە صەدەقەش بوو» [بوخاری و موسلم ڕیوایەتیان کردووە].

هیچ موسڵمانێکی ئافرەت واهەست نەکات کە -الله-هیچ وەرناگرێت ئیلا زۆر و گەورە، بگرە ڕەنگە درهەمێک پێش هەزار درهەم بکەوێت، وڕەنگە نیو خورما خاوەنەکەی صەدەقەی پێ بکات لەدونیادا لە ئاگری دواڕۆژ بیپارێزێت، لە مونذیری کوڕی جوریرەوە، لەباوکییەوە، دەڵێت: «لای پێغەمبەر ﷺ لەکەنار ڕوبارێک بووین، فەرمووی: گەلێکی پێ پەتی ڕووتی عەبا لەسەر هاتن، شمشێریان هەڵواسیبوو، زۆربەیان لە دەستکوورتان بوون بوون، بگرە هەموویان لەدەستکورتەکان بوون، پێغەمبەر ﷺ ڕووخساری سوور هەڵگەڕا لەکاتێکدا بینی چۆن هەژارێکن، چووەژوورەوە و پاشان دەرچوو،


مكتبة الهمّة
الدولة الإسلامية
شــوال ١٤٣٦ هـ

## نەکەن ماڵ کۆبکەنەوە ونەیبەخشن



الله تعالى: دەفەرموێت

وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ

(وە ئەوانەش کە زێڕوزیو کۆدەکەنەوە ونایبەخشن لەپێناوی الله (حەقی زەکاتی لێدەرناکەن) ئەو مزگێنی سزایەکی بەئێشیان پێبدە)

[التوبة: ٣٤]

فەرمانی بە بیلال کرد و بانگیدا وقامەتی کرد، نوێژیکرد پاشان ووتاری دا فەرمووی ({ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لە پەروەردگارتان بترسن ئەوە کە لەیەك گیان دروستی کردون})تاکۆتایی ئایەتەکە، {بەڕاستی الله چاودێرە بەسەرتانەوە} [النساء: ١]هەروەها ئایەتەکی سوڕەتی (الحشر): {لە الله بترسن وسەیرکەن چیتان بەخشیوە وئامادەتان کردوە بۆ بەیانی وەبترسن لە الله} [الحشر: ١٨].

(هەرپیاوێک صەدەقە بکات لە دینارەکەی، لە درهەمەکەی، لە جلوبەرگەکەی، لە قاپێ بەرهەمەکەی، لە قاپێ خورماکەی) -هەتا فەرمووی- (هەرچەندە بە کەرتە خورمایەکیش بێت) ووتی: کەسێک لە ئەنصارەکان هات و یەک فەردەی بەدەست بوو کە خەریکبوو لەدەستی بەردەبوەوە، بەڵکو نەیتوانی هەڵیبگرێت، گووتی: پاشان خەڵکی بەدوای یەکدا هاتن، هەتا دوو کۆمەڵە لە خۆراک و جلوبەرگم بینی، هەتا ڕووخساری پێغەمبەرم بینی ﷺ گەشایەوە، ئەڵێی بەئاڵتون ڕووپۆشکرابوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هەرکەسێ سونەتێکی چاک لەئیسلامدا ئەنجامبدات، ئەوە پاداشتی بۆخۆیەتی، وپاداشتی ئەنجامدەرەکانی لەدوای خۆی هەربۆ خۆیەتی، بەبێ ئەوەی پاداشتی هیچ کەسیان کەم ببێتەوە، هەرکەسێکیش سونەتێکی خراپ لەئیسلامدا ئەنجامبدات، ئەوە سزای خۆی بۆخۆیەتی و سزای ئەنجامدەرەکانی دوای خۆشی هەر بۆخۆی ئەگەڕێتەوە، بەبێ ئەوەی سزای کەسیان کەمبکرێتەوە)» [موسلم ڕیوایەتی کردووە].

ئەگەر ئافرەتێکی موسڵمان خێروچاکەی زۆری جیهادی شمشێری لەدەست بچێ، ئەوەش فەزڵێکی گەورەی -الله-یە کەبەخشیویەتی بە پیاوان، ئەوەتا دەرگای گەورەی جیهادی ماڵ کراوەیە لەسەر پشت چاوەڕوانی بازرگانە ئافرەتەکانە هەتا بازرگانییەکی هەرگیز نەدۆڕاو لەگەڵ پەروەردگاریان بکەن، شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە رحمه الله لە -الفتاوی الکبری-دا دەڵێت: « هەرکەسێ نەیتوانی بە جەستە جیهاد بکات بەڵام توانای جیهادی ماڵی هەبوو، ئەوا جیهاد بە ماڵ واجبە لەسەری، ئەوەش ووتەی ئەحمدە لە گێڕانەوی أبو الحکم، کە قاضی لە (أحکام القران) هێناویەتی، لەسوڕەتی براءة کە دەفەرموێت: {انْفِرُوا خِفَافًا وَثِقَالًا}، کەواتە نەفەقە لەپێناو -الله-دا واجبە لەسەر دەوڵەمەندەکان، لێرەشەوە لەسەر ئافرەتان واجبە جیهادبکەن بە ماڵ ئەگەر ماڵی هەبوو».

وە بەشێک لەئافرەتان ئاڵتوونی زۆر کۆدەکەنەوە و دەڵێن: ڕەنگە ڕۆژێک بێت هیچم نەمێنێ خەرجی بکەم -لەسەر دونیاش هەڵبەتە- و لەم ئاڵتونەم بفرۆشم.

بەڵام عائیشەی دایکی ئیماندااران رضي الله عنها ئەو سیاسەتەی نەگرتەبەر، عائیشە صەدەقەی کرد بە حەفتا هەزار هەرچەندە قەڵغانەکەی ڕزیبوو، بگرە معاویە رضي الله عنه سەد هەزار درهەمی بۆ دەنارد، کەچی هەر لەوڕۆژەدا لەپێش خۆرئاوابوون هەمووی دەبەخشی، کەنیزەکەکەی پێی گووت: « ئەگەر بە درهەمێکی ئەو پارەیە گۆشتت بۆئێمەش کڕیبا؟» دایکی ئیمانداران وڵامی دایەوە: «ئەی بۆ پێمت نەگووت؟» ئەگەر ئەوە حاڵی دایکی ئیمانداران و هاوەڵەکان بێت لەگەڵ صەدەقە و بەخشین لەپێناو -الله-، ئەوان خۆیان بوون، ئایا نابێت ئافرەتانی موسڵمانانی شوێنکەوتەی ئەوان کە -الله-لەفەزڵی خۆی پێی بەخشیون، زیاتر کاربکەن بۆ بەهەشتی شوێنی مانەوە، هەتا کاریان بەدەستە و ئارامن لەژیاندان، وە -الله تبارك و تعالى- فەرموویەتی: {ببەخشن لەوەی پێمان بەخشیون پێش ئەوەی مردنتان بێت وبڵێن ئەی پەروەردگار ئەگەر کەمێك دواتخستبام تا بمبەخشیبا ولەچاکەکاران بام * بەڵام الله کە کاتی مردنی هەر کەسێك هات دوای ناخات وەالله زانایە بەوەی ئەنجامی دەدەن} [المنافقون: ١٠-١١].

-کۆتا داوامان ئەوەیە سوپاس بۆ پەروەردگار، و درووود و سڵاو لەسەر پێغەمبەرمان محمد، و لەسەر سەرجەم هاوەڵان.

